پرۆژەی وەفا لە دەنگی یەکگرتوو رادیۆی هەولێر
بە هاوکاری لە گەڵ سایتی پێغەمبەر (ﷺ)

# ژیاننامەی کچەکانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم

منتدى إقرأ الثقافي

ئامادەکردنی

فرهاد گومەشینی

www.iqra.ahlamontada.com



## پێشەکی

بسم الله الرحمن الرحيم ..

الحمدلله والصلاة والسلام على سيد الخلق محمد وعلى آله وصحبه ومن والاه.

کتێبی ئەوجارەمان تایبەتە بە باسکردنی خانەوادەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم). بەتایبەتی کچەکانی خۆشەویست (صلی الله علیه وسلم) جارانی تر بە پشتیوانی خودای گەورە دێنیە سەر ئەوانی تر لە ئەندامانی خانەوادەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

لەسەرەتا کێشەك باسی دەکەین، وەك پێشەکییەك بۆ ناو بابەتەکە کە مەبەستمان چیە، کێشەکە بخەینە بەر باس و لێکۆلینەوە، باسی ئەو خالە گرنگانەی کە پێویستە بیزانین، زۆربەمان گوێمان لە باسی ژیاننامەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بووە، زۆربەمان لە وتارەکانی رۆژانی هەینی یان لە بابەتی مامۆستایان گوێمان لە باس کردنی ژیاننامەی ئەم خانەوادە بەرێزە کراوە. بۆیە ئەوانەی کە زۆر دووبارە کرایتەوەو ئەوانەی کە زۆر قسەی لەسەر کرایە زۆر ناپرژێین سەر ئەو لایەنە کە مەبەستمانە باسی لێوە بکەین، دێینە سەر ئەو لایەنانەی کە کەمتر قسەی لەسەر کرایەو کەمتر بەر گوێمان کەوتووە، ئەویش باسکردنی ژیانی ناو خانەوادەی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) هەر لەسەرەتای کە هاوسەری خۆی هەلبژارد کە خەدیجە (بوو رەزای خوای لێ بی) دواتر خێزانەکەی دیکەی دواتر مندالەکانی کچەکانی چۆنیەتی مامەلەکردنی خۆی (صلی الله علیه وسلم) لەگەل مندالەکانی.

دیاره قسەکردن لەسەر ئەو رۆژگارە کارێکی ئاسان نیه چونکه کۆمەڵە قسەیەك هەڵدەگری کۆمەڵە دەنگوباسێك هەڵدەگری. تا ئێستا زۆرجار زانایان خۆیان لەم باسە دەپارێزن. زۆریش لە زانایان نەهیان کردیه کە زۆر بە ووردی ئەو جانبە باس بکرێ بەتایبەت بنەماڵەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، دیارە زاناکان لەوێ نەوعەن ما قسەیان لەسە رکردووە کە ئینسان زۆر نەچێتە ئەو جانبە وخۆی بەم لایەنە سەرقاڵ نەکات..!! بەلاّم دوورگرتن یان باس نەکردن شتێکە ناکرێ خۆ مرۆڤ بە تایبەتی موسڵمان شتی دەربارەی نەخوێنتەوەو دەربارەی زانستی پێ نەبی، لەبەر ئەوەی قورئان لەوسەردەمە دابەزیە، قورئان لەو کاتە هاتۆتە خوارەوە قورئان لەو سەردەمدا قسەی لەگەڵ خەڵك کردوە، ئەو کاتە نەوەیەك دروستبوو قورئانیان لەبەر کرد و، قورئانیان کردبووە کردەوەی خۆیان وەك یاسایەکی رۆژانە لە ژیانی رۆژانەی خۆیان کاریان بە قورئان کردووە. ئەو جیلە بوونە ئەو جیلە کە بەڕاستی قورئان رۆژانە لەگەڵ ئەوان تەعامولی موباشری هەبووە، ئەوان جیلێك بووینە کە بەیانیان لەخەو هەڵدەستانەوە چاوەڕێی وەحی نوێ بووینە، کاتی نیوەڕۆیان بەسەردا هاتیە بەهەمان شێوە هەروەها عەسرو مەغریب و عیشایان دائمەن لە ئامادەباشی دا بوونە، کە ئێستا خوای گەورە چیان پێ دەفەرمووێ خوای گەورە چیان پێ دەڵێ. ئێستا لەم قۆناغە خوای گەورە چۆن وتاریان لەگەڵدا دەکاتن، چۆن قسەیان لەگەڵ دەکا، بەرەو کام ئاقار بیاهانژواتن بەچ ئایەتێك تەوجیهیان دەکا..!! دەبینین ئەگەر سەیری قورئانی پیرۆز بکەین لەگەڵ ژیاننامەی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) دەبینین بریتیە لەو شتەی کە خوای گەورە وەحی دەنێرتە خوارێ ناو ژیانی ئومەتەك کە ئینسانن کە هەڵە دەکەن کە دەژین کە

ئارەقە دەکەن کە برسیان دەبی کە تێنیان دەبێت، قورئان هاتتە خواروە قسە لەگەڵ ئەو خەڵکە دەکاتن، ئەو خەڵکەی لەو دەڤەرەی کە لێی دەژیا رۆژانە تەعامولی لەگەڵ قورئانی هەبوو راستەوخۆ، خانەوادەی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) نزیکترین کەس بوونە لەزاتی پێغەمبەر (صلى الله علية وسلم) نزیکترین کەس بوونە لە سەرچاوەی وەحی کە وەحی بەسەردا هاتیتە خوارێ لەو ژورە بوونە لەو ژوورەی عائیشە رەزای خوای لەسەربی کە قورئانی لێ هاتیتە خوارێ لە ژوری حەفسە هەروەها خێزانەکانی تری رەزای خوایان لەسەر بێت. دواتر پێغەمبەر (صلى الله علية وسلم) لەناو ژوورەکەی عائیشە نێژرایە، ئەو شتانە وامان لێ دەکا ئەگەر ئێمە نەپرژێنە سەریان زانیاریەکی باشمان نەبیتن کۆمەڵێك پرسیار لامان دروست دەبی دەتوانین بلێین وەلامی نیە، کۆمەڵێك پرسیار دێتە بەر گوێمان دەتوانین بلێین وەك هێلی سوور قسەی لەسەر نەکەین، باشە قورئانیش هاتیتە خوارێ کە من عەمەلی پێ بکەم و بیناسم و تەتبیقی کەم لە ژیانی خۆم، ئەی چۆن دەیکەم ئەگەر نەزانم چ هەیە، بۆیە زانینی ئێمە قسەکردنی ئێمە لەسەر ئەو ژینەگەو لەسەر ئەو جەوەی کە قورئانی لێ هاتۆتە خواروە و زاتی ئەو زاتە موبارەکەی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) کە قورئان تایبەت لەبۆ ئەو هاتوە (صلى الله عليه وسلم) وەك پێغەمبەرێك وەك رەسولێك کە ئەو دوا پەیامەی گەیاندیە ئەوە جێگای قسەو باسە کە ئێمە دەبێ لێی بزانین، کە شتی دەربارەی بزانین، بۆیە نامیلکەیە چەند تێبینیەکی گرنگ هەیە باسی دەکەین، بە ئومێدی ئەوەی بتوانین لە ئایندەدا ولەبەرهەمی داهاتوماندا بە چڕو پڕتر بپرژێنە سەری. ئەوەی کە گرنگە لێرانە لەم سەرەتایە لامان وازح بی و روون و ئاشکرا بی دەبی بە جورئەتەوە بلێین:

١- خەتەك هەیە فەصلەك جیاوازیەك هەیە لەنێوان نیگا(وەحی) ومێژوو(تاریخ)، وەحی ئەو شتەیە کە لای خوا هاتۆتە خوارێ سبحانە وتعالی کە جێگای دەستکاری نیە کە ئەمرە کە فەرمانە لای خوا سبحانە وتعالی قسەی لەسەر کرایەو دابەزیوە و، مێژووش بریتیە لە کردەوەی ئەو صەحابانە ئەو ئینسانانە کە لەو سەردەمە ژیاوە وژیانیان بەسەر بردوە مێژوویان تۆمار کردوە، بۆیە دەبی زۆر بە دەقیقی تەعامول لەگەڵ ئەوە بکەین کە ئەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) وەك قورئان گەیاندویەتی لەگەڵ ئەوی ودواتر کردەوەی صەحابەیە پاشتر روویداوە لە هەڵوێسێکی خێزانی پێغەمبەرە (صلی الله علیە وسلم) رابگرە تا هەر هەڵوێستێکی تری هەر مرۆڤێك، دەبی بزانین ئەوە هەڵوێستی مرۆڤە وای کردووە نەوەك وەحیە چونکە خێزانی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) مرۆڤە لەولا تر زاوایەکی پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) هەروەها برازایەکی پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) مامی و پوری هەرچی لەو بینەیەی هەیە ئەوانە هەموو مرۆڤن. هەر مامەی پێغەمبەرە (صلی الله علیە وسلم) ئینکاری خودا دەکا، ئینکاری دین دەکا، کەئەویش ئەبو لەهەبە، ئەبو تالب لەو لەحزەی کۆچی دوایی دەکات ئیمان بە پێغەمبەر ناهینی (صلی الله علیە وسلم) لەگەڵ ئەوەی دیفاعی لێ دەکاتن بەلآم دیفاعەکەی لەبابی خزمایەتی و مام و برازایەتی یە نەك بەرگری بێت لە زاتی وەحی، نەوەك بەرگری بێت لە پێغەمبەرایەتی، ئیمانەك بی بە وەحی کە بەسەری دا هاتیتە خوارێ، بۆیە ئەوانەی دەوری پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) مرۆڤن وەك هەر مرۆڤێکی تر کافری تێدا هەیە و، باوەرداریشی تێدایە، خزم وکەسی پێغەمبەریش (صلی الله علیە وسلم) هەروەك هەر مرۆڤێکی تر دەکرێ کافر بن ویان باوەردار.

٢- ئەلیرە هێلێکی ترمان بۆ دروست دەبێت یان بۆمان روون دەبێتەوە دەبێت، ئەویش: محمد (صلی الله علیه وسلم) بە وەحی بوێتە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)کەواتە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەپێی ئەم وەحیە شت دابەش دەکاتن بەرامبەرە خۆی بەو وەحیە سەیری مامی دەکات، بەو وەحیە سەیری پوری دەکات، بەو وەحیە سەیری ماڵ و منداڵی خۆی دەکات، وەحی بۆی دیاری دەکاتن ئەوەیان مامتە دروستە مامتە، بەڵام ئەوەیان لەسەر میللەتی تو نیە، بۆیە پێی دەڵێتن مامە بەس ئیمانی بینە تا بتوانن رۆژی قیامەت لەسەر ئەو قسەی تو شەفاعەتت بۆ بکەم لەدواتر مامی ئیمان ناهێنی. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە مامی وەفات دەکا، خێزانی و مامی لە یەك ساڵ وەفات دەکەن بەو ساڵە دەڵێن عامی حوزن ساڵی خەمناکی و پەژارەیی یان ساڵی غەمگینی، دروستە هەردووکیان لە یەك ساڵ وەفات دەکەن و هەردووکیشیان بەرگریان لە پێغەمبەر دەکرد و، هەڵوێستی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) بەرامبەر هەردووکیان وەك یەك بوو لە روویی خەمناکی ودڵ توندی بەڵام لە بۆ قیامەت هیچی پیێ ناکرێت و، ئەگەر بەرامبەر بانگەوازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەڵوێستی دژایەتی بوایە ئەوە وەك ئەبو لەهەب قسەی تری لەسەر دەکرا. ئەوەیە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) قورئان دەکاتە روئیاو دیدگای خۆی. دەبینین کاتێك ئیمامی عەباس ئەبو سوفیانی دەباتە سەر بەرزاییەك کاتیێ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) داخلی مەککە دەبیت لە(فەتحی مەککە) دەفەرمووێ ئەوە عەشیرەتی فلانە، ئەوە قەبیلەی فلانە، ئەبوسوفیانیش دەڵیێ: باشە من و ئەوانە بۆ توشم بەوانە بووە ئەوانە لە کویێ ومن لە کویێ، ئاخیری قسەك بە عەباس دەڵێتن پێی دەڵیێ: یا أبا الفضل ما أعظم شأن ابن أخيك؟

دەڵێ (ئەبو لفەزل) بەراستی ئەورۆ برازایەکەت ناوو دەنگەکی زۆر گەورەی هەیە بووە پیاوەکی گەورە، عەبباسیش لە وەڵامدا بە ئەبوسوفیان دەڵێ: إنها النبوه، ئەوەیان کە تۆ باسی دەکەی کە شەئنی کوڕی برامە نەخێر ئەوە شەئنی کوڕی برای من نیە ئەوە شەئنی پێغەمبەرایەتیەکەیە نەوەك کوڕی برام، بۆیە ئەمە لە مێژوو لەناو کۆمەڵگای صەحابە لەناو ئەو موجتەمەعەی کە پێغەمبەر لێی ژیایە (علیه الصلاه والسلام) دوو شت هەبوو وەحی ئیش دەکاتن موجتەمەعەکی بەشەریش هەیە ئەو وەحیە وەردەگری تەلەققی دەکاتن هەندێکیان وەك خۆی تەعامولی لەگەڵ دەکەن وەك ئاستی وەحی تەعامولی لەگەڵ دەکەن وپێ بەرز بوونەوە لە ئاستی وەحی تەعامولی لەگەڵ دەکەن، لەوانە ئەبو بەکری صدیق (رەزای خوای لێ بی) و عوسمانی کوڕی عەفانە عومەری کوڕی خەتابە عەلی کوڕی ئەبو تالبە(رەزای خودایان لەسەر بێت) ئەو صەحابانەی کە لە (عشره مبشره بالجنه)یان پێ دەڵێن ئەوەیە کە پێیان دەڵێن (أصحاب الشجره) کە بەیعەی (ریزوان) ناسراوە، ئەوە هەموویان دێن پێ بەپێ لەگەڵ وەحی تەعامول دەکەن گوێیان راگرتیە بزانن ئەوە وەحی خوایە (سبحانه وتعالی) چییان پێ دەڵێتن بەرەو کام لا ئاراستەیان دەکاتن وتەعامولی لەگەڵ دەکەن، هەشە کەمتر تەعامولی لەگەڵ ئەو وەحیەی دەکرد کە خۆشی لەناو مەدینە دەژیا بەڵام کەمتر تەعامولی لەگەڵ دەکرد( مەبەستم لە تعامول ئاستی جێ بەجێ کردنی وەحیە لە سەر ئەرز) بۆنمونە لە قورئانی پیرۆز دەبینی خیتابەکان هەندێك هەیە (في قلوبهم مرض) یەعنی لەگەڵ پێغەمبەر دەژیا (علیه الصلاة والسلام) بەڵام کابرایەکە دڵەکەی دەردەدارە لەنەفسی کات تائیفەك هەنە لەناو مەدینەی دەژین ئەسڵەن موناڤیقن باوەڕ بە قورئان هەرناهێنن عەجیب لەوەدا هەیە هەمان

قورئانە لەسەر پێغەمبەر دادەبەزی (علیه الصلاة والسلام) هەمان نیگایە هەر جبریلە دەیهێنی (سەلامی خوای لەسەر بێت) پێغەمبەر زاتی خۆیتی (صلی الله علیه وسلم) رادەوەستی دەبینی لە پشتی دوو کەس نوێژ دەکاتن یەکێکیان بریتیە لە ئەبو بەکری صدیق یەکێکیان بریتیە لە عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول هەرەچی (ئەبو بەکرە) دێ لەگەڵ ئەو نوێژەو لەگەڵ ئەو وەحیەی کەلەسەر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دێتەخوارێ تەفاعول دەکات ومەراتبی بەرز دەبێتەوە دەگاتە بەرزایەکانی ئاسمان، دەگاتە بەر ئاسمانەکان مەلائیکەتەکان فەخری پێوە دەکەن پێوە بەرز دەبیتەوە لەتەنیشتەوی کابرا (رأس النفاق)ە کوڕی سەلولی راوەستایە دەبینین ئەوجارە بە پێچەوانەی کار دەکاتن کە وەحی بۆ دێ چونکە تێی ناگا یان ناچتە ژێری یان دژایەتی ئەو وەحیە دەکا دەبینی لەتەنیشت ئەبوبەکرە بەلاّم لەبۆ (درك الأسفل) دەچتەخوارێ لەبەرئەوەی لە ئاستی وەحی تەعامول ناکات دەبینی بەو وەحیە گەورە نابی ئەسلەن زیاتر رۆدەچی بەرەو قولایی دۆزەخ و بەرەو جەهەننەم دەچیتن. ئەوە هەر هەمان وەحیە ئیش دەکاتن بەلاّم ئەوانەی کە ئیستیجابەی وەحیەکەی دەکەن وەك یەك نینە وەك ئەبوبەکری صدیق بن تەفاعولی زیاتری لەگەڵ دەکات و فاتیمە وخەدیجە عائیشە بنەماڵەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) زیاتر یەك دەست لەگەڵ ئەو نیگایە هەڵدەستن ودەیکەنە کرداری رۆژانەی خۆیان ئەو صەحابانەی کە ناویان لە مێژوو تۆمارکرایە بە (کیباری صەحابە)، دەبینین ئەوانە تەفاعولی راستەوخۆ لەگەڵ قورئان دەکەن و یەعنی (سمعنا وئەتەعنا)ی بەکاردەینن لەگەڵی بەرز دەبنەوە، کەسانێك هەنە ئەو کەسانە دڵەکانیان لەکەدارە دڵەکانیان نەخۆشە دروست نینە بۆیە تەعامولیان لەگەڵ قورئان تەعامولەکە لەو ئاستەدا نیە کە

ئەدائی رسالەکی پێ بکرێتن واتە لەحالەك لە (دڵەر راوکی ودوودلّیدا دەژین)بۆیە دەبینی مەراتبی ئەوانەی کە قورئان خیتابیان لەگەڵ دەکا لەقورئانی یەك ئاست نینە، واتە ئەوانەی کە لە قەزیەی ئەبرار تەعامولیان لەگەڵ دەکرێ ئەوانەی کە موحسنینن تەعامولیان لەگەل ّدەکرێ ئەوانەی کە موئمینن تەعامولیان لەگەڵ دەکرێ ئەوانەی کە ئینسانن خیتابی خاصیان هەیە (یا أیها الانسان) ئەوجا (یا أیها الناس) کە خیتابەکە عامترە ئێنجا (یا أیها الذین آمنوا) دواتر دەبینی خوای گەورە خیتاب لەگەڵ (یا أیها الذین کفروا) لەگەڵ کافرون قسە دەکاتن لەولاتر لەگەڵ مونافیقین خیتاب دەکاتن ئەو خیتابەی دێتە خوارێ ئەوانەی کە تەفاعولی لەگەڵ دەکەن ئەوانە جیلی صەحابەی واتە (رەعیلی یەکەمن) تەعامولی لەگەڵ دەکەن لەگەڵ بوونی رەعیلی یەکەم کە ئەوەندە گەورەوبەرێزن) کەوات گوتاری قورئانی کۆمەلگەی پێغەمبەر دەکات بەچەند بەش ئەوەش دیلالەی شارەزایی خودایە بە ناخ وحەقیقەتی مرۆڤەکان، دەبینی لەتەك بڕواداران کەسانێك هەن بەپێچەوانەوە هەر لەژێر باری مەفاهیمی نەفامی ئەو کاتەی کە (بەسەردەمی جاهلی) دەناسرێت کە کلتورێکی تایبەتی هەبووە کە کۆمەڵێك چەمکی تایبەتی خۆی هەبووە گوزەر دەکەن، دەبینی هەندێك لە موسڵمانەکانیش کە لەگەڵ پێغەمبەر دەژیان (صلی الله علیه وسلم) نەیانتوانیە وەك پێویست لەژێر ئەو بارە قورسەی جاهیلیەت دەربچن،کۆمەڵێك چەمك و مەفاهیمی جاهیلی هەیە لەناو کیانیاندا مایە، چونکە ئەوانەی قورئانیان بەسەردا دادەبەزێت مرۆڤن وخودای گەورە سەر پشکی کردون لەوەی بەهەشت هەڵدەبژێرن یاخود جەهەنم. وەحی تەعامولی موباشر دەکاتن لە گەڵ مرۆڤ دەیەوێ بسەلمێنی ئەوەی کە دەبەزیوە بۆ مرۆڤ هاتوە و مرۆڤ خۆی سنگی مەحەکە

له وەرگرتنی یان ڕەت کردنەوەی. هەموو قورئانیش سەیری تاقەی بەشەری کردوە شتێك لە ئەمر نەهاتوتە خواری کە مرۆڤ بۆی نەکرێت.

بۆیە لەسەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەحی هەیە لەگەڵ عەمەلەکی تاریخی بەشەری کە تۆمار دەکرێن ئەو عەمەلە بەشەریە موناففی تێدا هەیە موئمینی تێدا هەیە جیلەکی تێدا هەیە لە قورئان دەگاتن بۆیە دوو شت هەیە لەم سەردەمە یەکەم دابەزینی قورئانی پیرۆز دووەم تۆمارکدنی مێژوو لەلایەن مرۆڤەکان هەر لە تەقواو دینداری تا کورفرو نیفاق هەمووش سەرپشکن، وکەسیش معصوم نیە جگە لە معصوم نەبێت. بۆیە ئەوەی لە مێژوو ئیسلامی رووی داوە هەمووی دینداری نیە چونکە بەشێکی کرداری مرۆڤە بۆیە ئەوەی لە قورئان هاتوە یان فەردمووودەی راستی پێغەمبەرە(صلی الله علیه وسلم) بەهیچ شێوەیەك لە شێوەکان، بۆیە دەبی تەعامولی ئێمە لەگەڵ وەحی بی نەك لەگەڵ فەرهەنگ وکلتوری مرۆڤەکان،

باسمان کرد کە جیاوازی هەیە لەنێوان ئەوەی کە قورئان کە وەحیە لەگەڵ ئەوەی کە رووداوی مێژوویە روودەداتن، لەولاوە وامان دانا گوتمان کەجیاوازیەك هەیە وەباسمان کرد، حالەی تەبیعی دێتە پێش ئەویش بریتیە لەوەی کە جیاوازیەك هەیە لەنێوان پرەنسیپەکانو ومیکانیزمی رەفتار لەگەڵ ئەو پرەنسیپانە، مەبادیئ پێویستی بە میکانیزم هەیە بۆ جیَ بەجیَ کردنی. وەك زانراوە ئیجتیهاد دەکریَ لەو جێیەی کە دەقی تێدا نیە ئیجتیهاد دەکریَ لەمەسائلی نویَ هەر لە سیستمی کۆمەلایەتی رابگرە تا بوارەکانی تر پێویستی بە فەتوای نویَ هەیە، دەکریَ ئەو هۆکارانەو ئەو کەرەستانەی کە رۆژێك لە رۆژان بەکار هاتوە ئەمرۆ بەکار نێت، بۆیە نابیَ بەهەمان دامەزراوە بەهەمان سیستەمی کۆن کار

بکرێت، بۆیە ناسینی دیراسەی تاریخی ئیسلامی یان فیقهی ئیسلامی دەبێ زۆر دەقیق تەماشای بکەین لەهەر سەردەمێك بێت. سەردەمی دەولەی ئومەوی سەردەمی پاشتر، لەسەردەمی سەدەی یەکەمی کۆچی سەدەی دووەمی کۆچی سەدەی سێیەمی کۆچی تا دەگەیە سەدەی شەشەمی کۆچی، لەسەردەمی ئەو موجتەهیدانە (رەحمەتی خوایان لێبێ) ئیمام مالکە ئیمامی شافعیە ئیمامی ئەحمەدە، دەبینی ئەگەر سەیریان بکەین کەرستەی ئیجتهیادیان فەرقی هەبووە لەگەڵ یەکتر لەکەرەستەکان، بۆیە مەدرەسەی ئەهلی (حەدیس) هەیە مەدرەسەی ئەهلی (رەئی) هەیە، کەواتە لەکەرەستەی سیستەمی کۆمەلایەتی رابگرە تا دەگەیە سیستەمی سیاسی سیستەمی ئابووری پێویستی بەدەستکاری هەیە بۆیە ناکرێ بەو چاوەی سەیری مەبدەئ دەکرێ بە هەمان شێوە سەیری کەرستە بکرێت. خاڵەکی دیکە هەیە کەدەبێتە خاڵی سێیەم

٣- ئەویش: ئەوەمان بۆ دەردەکەوی کە مرۆڤ وەك خۆی پیرۆز نیە بەڵکو بەرێزە هەرووەك کەرستەکان پیرۆز نەبون تەنیا پرنسیپەکان نەبێت مرۆڤەکانیش بە هەمان شێوە، ئەوەی کە قورئان هێناویەتی وەك پرەنسیپەکان ئەوەیان موقەددەس وپیرۆزن بەلام ئینسانەکان موقەددەس نین بەڵکو بەرێزن، کەواتە لێرە دیسان فەسلێك دروست دەبێ جیاوازیەك دەبێ لامان روون بێت، ئەم قاعیدەش هەموو کەس دەگرێتەوە تا ناو عائیلەی پێغەمبەریش(صلی الله علیە وسلم)، لە خەدیجەی را بگرە تا کۆتایی، خەدیجە موقەددەس نیە بەلام خەدیجە خێزانێکی پێغەمبەرە (صلی الله علیە وسلم) ، بۆیە وەکمرۆڤ بەرێزە بەلام نە پیرۆزە، ئێمە دەبێ ئەوەمان لاروون وئاشکرا بێت کە باسی خەدیجەیە (رەزای خوای لێبێ) وەك مرۆڤێکی بەرێزی باوەڕدار، هەروەها باسی زەینەب و

روقەیەیەو ئوم کەلسوم و فاتیمەیە وعائیشە (رەزاو رەحمەتی خوایان لێبی) ئەوانە بریتینە لە کۆمەڵە مرۆڤێکی بەرێزن کە خوای گەورە هیدایەتی داینە، بەقورئان بەرێز بووینە بەڵام پیرۆز نەبووینەو پیرۆزیش نابن. کاتێ ئێمە باسی ئەو خانەوادا بەرێزە دەکەین دەبی ئەوەمان لەبیر نەچێت کاتێ دەچینە ناو ماڵی پێغەمبەری (صلی الله علیە وسلم) کە پاشان باسی دەکەین، دەبی بزانین پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) سێزدە ساڵان لە مەککەی ماوە سێزدە ساڵان وەحی بۆ هاتۆتە خوارێ ئەو سێزدە ساڵەی کە دەبێتە پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) فاتیمەی هەیە کە چوارەمین کچیەتی کە تەمەنی پێنج شەش ساڵە، کەواتە لەناو ماڵی پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم)بزاڤێکی مرۆڤی هەیە وەك هەر ماڵەك، کچە گەورەکەی عازەبە بەتەعبیری خۆمان کە دەڵێین کچە گەورەکەی عازەبە، دواتر کچە گەورەکەی بەمێرد دەدا زەینەب چووە رێی خۆی دوایی (ئوم کەلسوم) دواتر (روقەیە)، دواتر فاتیمە کچەکەی تر (رەزای خوایان لێبی) .

حەزدەکەم کاتێك باسی خانەوادەی پێغەمبەر دەکەین لامان روون بی کە ئەوە عائیلەیە عائیلەی موحەممەدە (صلی الله علیە وسلم) لە نێو ئەم ماڵە لەژوورەکان کچ بەمێرددان هەیە زاوا دێتە ماڵیان مێوانداری هەیە، ئەوە نەبی کەوا ئێمە بەکورتی لەکۆڵە خۆی کەینەوە، ئاخر ئەو شتە وانیە دەبی ئەو سێزدە ساڵە ئەتو لەپێشت وازح بی کە پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم)، سێزدە ساڵ هەر ساڵەك ١٢ مانك هەر مانگەك ٣٠ رۆژ هەر رۆژەك ٢٤ سەعات، پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) لەناو ماڵی خۆی سوورِایەتەوە لەناو ژوورەکان خێزانی هەبووە فشاری قورەیشی لەسەربووە فشاری فەقیری لەسەربووە فشاری کچ بەمێرددانی لەسەر بووە، کچ دەچێتە رێی خۆی پێویستی بەمەسرەفە، ئەوە

ئامۆزای هاتیه داخوازی کچت دەکاتن، ئەوە جیرانی هەبووە (صلی الله علیه وسلم)، ڕێگایەك هەبووە کە پێغەمبەر(صلی الله علیـه وسلم)کە هاتووچی کردیە ئەگەر جەنابتان بێتە بەر چاوتان سەیری بکەن دەبینین پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چەند جار لەدەرکەی ماڵی خۆی چوویتە دەرێ، هاتۆتە ژووریێ، چەند جار فاتیمە بەپیلی وەچووە کە بابی هاتۆتەوە خۆی بەباوەشی بابی دادایە، چەند جار ئەو کچە جاحێلانە بەخێرهاتنەوەی باوکیان کردوە، چەندجار کچی جاحێل بەبێ برا لە ماڵەوە دانیشتون، ئێمە لە کۆمەڵگەیەك دەژین دەزانین کاتێك ئەگەر پێنج شەش کچ هەبن بێ برا بن، چەند هەست بەبێ نازی دەکەن، ئەو چوار کچەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) (ڕەزای خوایان لەسەر بی) دەبینی باب دێتەوە ماڵێ دەبی چەند بەپەرۆشەوە چاوەڕێی باوکیان بکەن، لەکاتێك برایان نیە لەگەڵیان لەماڵێ بی بحافلێن و ئاوەدانیان بۆ دروستکاتن، دێتە ژۆرێ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) باوکە، ئەو باوکەیە دێتە ژۆرێ دەبێ ئەو کچە عازەبانە چەند دڵخۆش بن بەو زاتە موبارەکەی دێتە ژۆرێ (صلی الله علیه وسلم)، دەبێ چەند دڵخۆش بن کاتێ خزمێکیان دێتن، یەعنی بەڕاستی ناو خانەوادەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) عائیلەیە وەك هەر عائیلەکی دیکە.

ب پێغومبەر (صلی الله علیه وسلم) کاتێك بو بە پێغەمبەر هەر چوار کچی هەبوە وسێیانی مارەبڕن، کەواتە بوویتە سێزدە یواتە ژیان بەکامل واتە خواردنی ژەم هەبووە هەر ڕۆژی سێ ژەم خواردن دەخورا، شتی دیکە مەتڵەبە لەو عائیلەی حەرەکە بکرێتن لەو ماڵەی، یەعنی چی یەعنی ئێمە دەبی ئا ئەو کەسانەی ئەو ئیشەیان کردیە ئەو کەسانەی کە قورئانیان بەسەر ماڵانیان نازل بووە ئەو جێ و دۆشەکەی کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)وەحی بەسەردا

هاتۆته خواریٚ، ئەو خێزانەی کە لەلای پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) وەحی بۆ دێتن ئا ئەوانە پیرۆز نینە بەلاّم بەرێزن. قسەکردن لەسەریان یان باسکردنیان دەبیٚ زۆر بەتەقدیرەوە باس بکریٚ، قسەکردن لەسەریان دەبی لەقیممەی ریٚزلیٚ گرتن بی، چونکە قابیلی دیراساتە بەلاّم قابیل بیٚ حورمەتی نیە. ئەگەر دراسەی ژیانیشیان بکریٚت دەبیٚت بە حورمەتەوە سەیر بکریٚن چونکە ئەوان قورئان تەزکیەی کردون نابیٚ تۆمەت بار بکریٚن. بەلاّم ناتوانین باسیان نەکەین.

٤- لەبەر ئەوەی ئەوانە ئەو کەسانەن کە قورئان لەسەر دەمی ئەوانە دابەزیوە قسەی لەسەر ئەوان کردوەو ئەحکامە شەرعیەکان لەو کاتە تۆمار کراوە، بۆیە ناسینیان زۆر گرنگە ودەبیٚ موسڵمانان ئاگاداری ژیاننامەی ئەم خانەوادە بەرێزە بیٚت بۆ ئەوەی لەسەر ریٚگای ئەوان بڕوات وخێر وچاکە بەدەست بیٚن ئەوەی ئیٚستا ئیٚمە لە پەرتوکە دەیخەینە بەر دەستی بەرێزت ژیاننامەی کچانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ ئەوەی بەرێزت ئاگاداری رەوشتە جوان وپاکەکانیان بی. دواتر بە پشتیوانی خودا دێنە سەر ژیانی فاتیمە و ئیمامی عەلب بە ووردی چونکە دواتر گرفتەکان ئەلەویٚ سەریان هەڵداو مەزاهب دروست بوون.

عەبدوللەتیف یاسین

بەڕیٚوەبەری دەنگی یەکگرتوو - رادیۆی هەولیٚر

سەرپەرشتیاری ماڵپەڕی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)

٢٦ی شەعبانی ١٤٣٠ ك بەرامبەر ٢٠٠٩\٨\١٨

هەولیٚر

## خاتوو زەینەب "رەزای خوای لەسەر بێت"

زەینەبی گەورە.. یەکەم زێڕو گەوهەر بوو، خودای گەورە بەخشی بە دایکی موسڵمانان (خەدیجە)ی گەورەو پێغەمبەری نێردراوی خودای گەورە (محمد) (صلی الله علیة وسلم).

(زەینەب) بووە سۆمای چاوی دایك و باوکی. ماڵی پێغەمبەر (صلی الله علیة وسلم) پاش لە دایکبوونی (زەینەب) پڕبوو لە خۆشی، کە پێشتر لەم جۆرە خۆشی یەی نەدیبوو، پێش لە دایکبوونی ئەم کچە بچووکەی پێغەمبەر (صلی الله علیة وسلم)، جۆرێك لە ماڵ چۆڵی بە ماڵەوەیان دیار بوو.

چاوەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هیچ کاتێك لەسەر (زەینەب) نە ئەگوازرایەوە، تەماشای ئەم پێکەنینە جوان و پڕ شەنگەی (زەینەب)ی دەکرد، کاتێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) (زەینەب)ی لەباوەش دەگرت و بەسینگی خۆیەوەی دەنووساند، منداڵی خۆی دەهاتەوە یادی، لە منداڵی یەوە هەستی بەم جۆرە لە باوەش گرتنە نە دەکرد، چونکە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کاتێك لە دایك بوو، باوکی وەفاتی کردبوو، پێش تەواوبوونی قۆناغی منداڵی دایکیشی کۆچی دوایی کردبوو، بۆیە دەهاتەوە بیری یەتیمە جوان بێنازەکەی مەکە، خودای گەورە ئەم ناخۆشیەی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) تەعویز کردەوە بە بە بەزەیی زۆری خۆی و تەواوەتی نیعمەتەکانی. خودای گەورە خەدیجەی بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەکو دایك و باوك و هاوڕێ تەرخان کردبوو بە سۆزو خۆشەویستی پێغەمبەری لە باوەش

گرتبوو، لەولاشەوە لایەنێکی گەورەی بۆ خۆشەویست (صلی الله علیه وسلم) پڕ کردەوە لەلایەنە مرۆڤایەتیەکەی بە بەخشینی زەینەبی ئێسك سوك رووگەش.

## مارەبرینی زەینەب لە عاصی کوڕی رەبیع:

سالآنێك هات و سچو زەینب عازەب بوو، کچە گەورەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گەورەبوو، پێگەیشت و کاتی بە شوودانی هات، هەروەکو گوڵ پاك و گەشایەوە، ئەوەبوو خەڵکانێکی زۆر لە گەنجانی بنەماڵەو پیاوانی شاری مەککە دەهاتن بۆ خوازبێنی زەینەب، بەڵام قەدەر وابوو، هیچیان نەدەبونە هاوسەری ژیانی و خوازبێنیەکان رەفز دەکرانەوە. تاکو رۆژێکیان (ئەبو العاص)ی پلکزای زەینب (هالەی کچی خوەیلەید)ی دایکی رەوانەکرد، بۆ خوازبێنی زەینەب.

ماڵی (هالە) لە ماڵی خەدیجەی خوشکی نزیك بوو زوو زوو سەردانی یەکتریان دەکردو وەك دایك سەیری خەدیجەی خوشکی دەکرد، خەدیجە بە خوازبینیەکەی خوشکی رازی بوو و، زۆر پێخۆشحاڵ بوو بەم داخوازییە. بەڵام پێویستی بە رەزامەندی باوکی زەینەب (صلی الله علیه وسلم) هەیە، کاتێك پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لێ ئاگادار کرایەوە، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) رازی بوو، داواکاری خەدیجەی رەت نەکردەوە، کە هیچ داوایەکی خەدیجەی پێشتر رەت نەکردبوە.

لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وخەدیجە جگە لە پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ (ئەبو لعاص)زۆر خۆشیشیا دەویست، چونکە کەسێکی لێوەشاوەبوو، جوان و رێك و پێك بوو، کەسێکی بازرگان بوو

لەنێوان شام و مەککەدا بازرگانی دەکرد. دوو سەفەری هاوینەو زستانەی دەکرد. نیشانەی وەفاداری و پیاوەتی و راستگۆیی پێوە دیار بوو، نموونەی سوارچاکێکی عەرەب بوو، ئیتر رۆژێك دیاری کراو (زەینەب)یان لە (عاص) مارەبڕی، ماڵی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) پڕبوو لە خۆشی و بەختەرووەری بە بۆنەی بەشوودانی (زەینەب)ی کچە گەورەیان. بەڵام فاتیمە(خودا لێی رازی بێت) زۆر دڵ تەنگ بوو چونکە خوشکە گەورەی کە لە جێی دایکی بوو هەردەم لە باوەشی بوو ئەوە ئێستا بەجێ دەهێڵی ودچێتە ماڵی خۆی ئەوکاتەش فاتیمە لەم کارە حاڵی نابێت تەنیا ئەوە نەبێت خوشکە خۆشەویستەکەی وا ماڵی لێ جیا دەکاتەوە .

ئەوەی مەبەست و هیوا بوو لە بەمێرد دانی زەینەب خۆشی وبەختەرووەی بۆ ئەم کچە دابین بکرێت لە ماڵی مێردەکەیدا، چونکە زەینەب لەماڵی باوکیدا لە خۆشی و بەختەوەری و سۆزدا ژیابوو، زەینەب دوای گواستنەوەی، لەماڵی مێردەکەیدا بە بەختەوەری دەژیا لەگەڵ هاوسەرە خۆشەویستەکەی (ئەبولعاص)، زۆر رێزی یەکتریان دەگرت و کێشەیان لەگەڵ یەکتردا نەبوو،

رۆژێك (ئەبولعاص) بە زەینەبی گوت: دەچمە سەفەری شام بۆ بازرگانی، پاشان خواحافیزی لێ کردو لەگەڵ کاروانەکەی بەڕێ کەوت، زەینەبی بەجێهێشت لەلای دایکی بەو هیوایەی لە ماوەیەکی نزیکدا بگەڕێتەوە.

## دەرکەوتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام و
## ئامادەنەبوونی ( ئەبولعاص ) لە مەککەدا :

خودای گەورە حەزرەتی (جبریل)ی رەوانە کرد، بە پەیامێکی پیرۆز بۆ لای (محمدی کوڕی عبدالله) (صلی الله علیه وسلم) کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام بوو، (محمد)ی (صلی الله علیه وسلم) کرد بە نێردراوی خۆی بۆ لای بەندەکان بۆ ئاگادارکردنەوەیان لە حەقیقەتی دونیا ژیان ومردن، دوورکەوتنەوەی خەڵك لە نەزانی و خراپەکاری دا و، بگەڕێنەوە لای خوداو، خودای خۆیان بپەرستن و واز لە هاوەڵ دانان و بتپەرستی بێنن و خودای گەورە بە تاك و تەنیا بناسن.

ئیتر ئەوەبوو، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە خێزانەکەیەوە دەستی پێ کردو بانگی خزم و کەسوکارەکانی تری کرد بۆ ناو ئاینی پیرۆزی ئیسلام. سەرەتا خێزان وکچەکانی و دواتر هەندێك لە برادەرو خزم وکەسانی تر هاتنە ناو ئاینی پیرۆزی ئیسلام.

وەك زانراوە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دوای گەڕانەوەی لە ئەشکەوتی حیرا بە لەرزو ترس هاتە خوارەوە رووداوەکەش ئاشکرایە، هەروەها رۆڵە بەرێز وگەورەکەی خەدیجە بەهیچ شێوەیەك مێژوو ناتوانێت لەبیری بکات، بۆ نمونە هەر کاتێك نوسەرێك یان ووتاربێژێك یان واعزێك یان ئەکادیمێك باس لە سەرەتای هاتنە خواری نیگا دەکات دەبێ ئاماژە بە رۆڵی ئەم کەڵە ژنە بکات.

زەینەب گەڕایەوە ماڵی باوکی، کاتێك بینی باوکی وا لەناو جێگایە پرسیاری کرد لە حاڵی باوکی، خەدیجەی دایك بەهەمان عەقلی گەورەو کارامە کچەکانی کۆکردەوە وبەسەرهاتەکەی بۆیان گێڕایەوە، ئەو کاتە کچەکان

هەموویان باوەڕیان بەپێغەمبەرایەتی باوکیان هێنا باوکێك کە بە (صادق الامین) ناسراو بوو چۆن باوەڕی پیّ ناهینن؟.

لەم کاتەدا (ئەبولعاص) لە سەفەری شام دابوو، کاتێك گەڕایەوە لە ڕێگا لە خەڵکانی تر گوێی لەم هەواڵە بوو. کە ئایینی ئیسلام بڵاو بوویتەوە لە لایەن خەزووریەوە، واتە لە لایەن پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم)، بەپەلە گەڕایەوە ماڵ و لە زەینەبی خێزانی پرسی: ئەم پڕوپاگەندەیە چی یە؟! وا بڵاوبوویتەوە لە نێوان خەڵك، گوایە باوکت ئاینێکی نوێی هێناوتە ناو قورەیش، خوداوەندەکانی قوریش بە درۆ دەخاتەوە.

زەینەب بەوپەڕی ئازایەتی یەوە لەوەڵامدا گوتی: " ئەمە پڕو پاگەندە نی یە، بەڵکو ڕاستە باوکم بۆتە پێغەمبەر ئەمە ڕاستە وەکو ڕۆژ، باوکم بانگەواز بڵاودەکاتەوەو، ئێمە هەموومان موسڵمان بووین، دایکم و من و خوشکەکانم".

(ئەبوالعاص) گوتی: باوکت لەلای من تاوان بار نیەو _ئەم رستەیە عەرەب بەکاری دەهێنن بۆ کەسێك کە ڕابوردی پاك وبێگەرد بێت_، رقم لێی نیە بەڵام ناتوانم باوەڕی پێبهێنم لەبەر قەومەکەم دواتر چیم پیّ دەڵێن (ئەبولعاص) وازی لەئاینی باب وباپیران هێناوە وپاشگەز بویتەوە، حەزناکەم بنەماڵەکەم شەرمەندە بکەم، بەڵام زۆریشی لە خێزانە خۆشەویستەکەی نەکرد وهەرکەسە لەسەر ئاینی خۆی ماوە.

## پیلان دانان بۆ تەلاقدانی زەینەب و خوشکەکانی:

موشریك و بێ باوەڕەکان زۆر ئازاری پێغەمبەر و(صلی الله علیه وسلم) موسڵمانانیان دەدا، بە هەموو جۆرێك ئەشکەنجەیان دەدان، بەوەشەوە نەوەستان بیریان لە پیلانێکی تر کردەوە، ئەویش ئەوەبوو، تەلاقدانی کچەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ ئەوەی زیاتر ئازاری دەروونی پێشەوای مرۆڤایەتی بدەن.

قورەیشیەکان.. هەندێکیان بە هەندێکیان دەگووت: خاکتان بەسەر.. بەڕاستی ئێوە خەمتان لەسەر (موحەممەد) هەڵگرتووە بەوەی گەنجەکانتان کچەکانی ئەویان هێناوە، جا ئەگەر کچەکانی بەسەردابدەنەوە، ئەوا بەم ئافرەتانە خەریك دەبێت).

ئەوانی تر گوتیان: ئەوەی بیرتان لێ کردۆتەوە، باشترین بیروڕایە. ئەوەبوو (ئەبو لەهەب) فەرمانی بە کوڕەکانی کرد کچەکانی (موحەممەد) تەلاق بدەن کە (روقیەو ئوم کەلسوم) بوون و هێشتا نەگوازرابوونەوە. کوڕەکانی چوون (روقیەو ئوم کەلسوم)یان تەلاق دا، کافرو بتپەرستەکان بەوەشەوە نەوەستان هەندێکیان چوونە لای (عاص) و پێیان گوت: (خێزانەکەت تەلاق بدەو رەوانەی ماڵی باوکی بکەوە، ئێمە ژنێکی ترت بۆ دەهێنین، چۆنی حەز دەکەی لە جوانترین وژیرترین کچانی قورەیش).

(عاص)یش پێی وتن: نەخێر سوێند بەخوا، من خێزانی خۆم تەلاق نادەم و بە هەموو ئافرەتەکانی جیهانی ناگۆڕمەوە.

دواتر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێی خۆش بوو، (زەینەب)یش تەلاق بدرێ و لەلای بێ باوەڕان نەبێ وەکو دوو کچەکەی تری.

## پەنابردنی موسلمانان بۆ دۆڵی (ئەبو تالیب):

پاش ئەوەی قورەیشیەکان ئازارو ئەشکەنجەی زۆری موسڵمانیان داو بەردەوام بوون لە ئەزیەت و ئەشکەنجەدانیان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ بنەماڵەکەی و هاوەڵەکانی و یەکێکیش لە بێ باوەڕان کە (ئەبو تالیب)ی مامی بوو، روویان کردە (دۆڵی ئەبو تالیب) بۆ ئەوەی رزگاریان بێت لە دەست ستەمی بت پەرست و بێ باوەڕەکان، (ئەبو تالیب) هەرچەند باوەڕی نەهێنابوو بەڵام هەردەم پشتی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) بەرنەدەداو هەردەم هاوکاری بوو، یارمەتی زۆری دەدا.

بێ باوەڕەکان بەردەوام بوون لە هەڵگەڕانەوەو یاخی بوون، بۆیە قورەیشیەکان هەڵسان بە گەمارۆدانی موسڵمانان لەم دۆڵەدا بە ستەمکردنێکی گەورەی دڵ رەقانە، بۆ ماوەی (٣) ساڵ گەمارۆیان خستە سەریان و هەموو جۆرە مامەڵەکردنێکیان لێ قەدەغەکردن، تاکو ژن و ژنخوازیشیان لێ قەدەغەکردن، ئەم ستەمە ماوەی (٣) ساڵی خایاند، موسڵمانەکان لە ژیانێکی زۆر ناخۆش وسەختدا دەژیان، بە دەست برسیەتی و تینوێتی و نەخۆشی یەوە دەیانناڵاند، هەندێك خواردن شایەنی خوارد نەبوو، ئەمان لە ناچاریدا دەیان خوارد. دوای (٣) ساڵ هەندێك لە کەس وکاری موسڵمانەکان، کە بێ باوەڕبوون بیریان لێ کردنەوەو ویژدانیان جولا، ئیتر تاکو کەی خزمەکانیان ئاوا برسی و تینوو نەخۆش بن و، ئەوانیش لە ژیانێکی خۆش و بەختەرەوەدا بژین و ژن و ژنخوازی بکەن و ژن بهێنن وکچەکانیان بە شوو بدەن، ئەوانیش لێی بێ بەش بن. ئەوەبوو چەند کەسێك یەکیان گرت و بڕیاریاندا و بەگوێی کافرەکانی تردا نەکەن و گەمارۆکەیان لەسەر لابردن.

دوای ئەوەی موسڵمانان لە دۆڵەکە هاتنە دەرەوە، زۆر هیلاك و ماندوو بێ هێزبوون و بەئازاربوون، پاشان مامی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەخۆش کەوت و وەفاتی کرد، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) زۆر دڵتەنگ و خەمبار بوو لە وەفات کردنی مامی دا، هەرچەند باوەڕی نەهێنابوو، بەڵام هەردەم پشتیوانی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) دەکرد لە ناخۆشی یەکانی دا، پاش (٣) رۆژ لە دوای مردنی (ئەبو تالیب) دایکی ئیمانداران (خەدیجە)ی خێزانی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) ئەویش وەفاتی کرد (رەزای خوا لەسەربێت) بە نەخۆشی و لەناوجێدا گیانی سپارد، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ کچەکانی (زەینەب)و(روقەیە)و (ئوم کەلسوم)و (فاتیمە) فرمێسکی خۆشەویستیان بۆی دەڕشت و توسلیمی ئەمری خودابوون.

کۆچی دوایی (خەدیجە)ی گەورە، کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەکو وەزیرێکی راست و راستگۆ بوو بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیەوسلم)، موسڵمانان ئەم ساڵیان ناونا (ساڵی خەمناکی) ـ (عام الحزن) چونکە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دوو خۆشەویستی بەوەفا وئەمەکداری لەدەستدا، ئەوانیش (ئەبو تالیب)و (خەدیجە)ی خێزانی. کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) زۆر پێویستی بەم دووانە هەبوو، هیچی بۆ نەمایەوە تەنها ئارامگرتن و رازی بوون بە فەرمانی خودای گەورە، هیچ نارەزاییەکی دەرنەبڕی تاکو خودای گەورەی لێ زویر بێ.

## کۆچکردن بۆ (مەدینە):

دوای زۆربوونی ژمارەی موسڵمانان لەشاری مەدینەو بەستنی پەیمانی گەورەی (عەقەبە) لە نێوان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و موسڵمانەکانی مەدینەدا، بەردەوام بوونی ئازاردانی موسڵمانان بە دەستی قورەیشیەکان، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی بە موسڵمانەکانی مەککەدا کۆچ بکەن بۆ مەدینە، ئیتر یەك یەك و دووان وسیان دەستیان کرد بە کۆچکردن بۆ مەدینە، تاکو دواتر خوای گەورە فەرمانی کرد بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەویش کۆچ بکات و شاری مەککە بەجێ بهێڵێ لەگەڵ (ئەبوبەکری) هاوەڵی دا، ئیتر ئەوەبوو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ (ئەبوبەکر) کەوتنەڕێ و دوای ماندووبوون و ئازارو ترسێکی زۆر، خوای گەورە ئەوانی پاراست و بە سەلامەتی گەیشتنەڕێ، دواتریش کەس وکاریان لە دوایان چوون، لە خانەوادەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تەنها (زەینەب) مایەوە، ئەویش لە ماڵی مێردەکەیدابوو، تاکو دوای جەنگی بەدر.

## جەنگی بەدر و سەرکەوتنی موسڵمانان:

دوای کۆچکردنی موسڵمانانی مەککە بۆ مەدینە وگەیشتنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ مەدینەو دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی و خۆ قایمکردنی موسڵمانان، بەردەوامی ستەمی موشریکەکانی مەکە بە تایبەت دوای شەهیدکردنی (عەبدوڵڵای کوڕی عەمر)و خوای گەورە ڕێگای دا بە پێغەمبەرو موسڵمانان بۆ شەڕکردن لەگەڵ قورەیش بکەن، بەرامبەر بە ستەمەی دەرهەق بە موسڵمانان ئەنجامی دەدەن، لە برسی کردن و دەستگرتن بەسەر ماڵ و سامانیان

و لێدان و شەهیدکردنیان، موسڵمانان هەڵسان بۆ ڕێگەگرتن لە کاروانێکی قورەیشیەکان کە لەشام دەگەڕایەوە، بەسەرۆکایەتی (ئەبو سوفیان)، کاتێك (ئەبو سوفیان) زانی لە پێشی دانیشتینە، هەواڵی دا بە قورەیش و ڕێگای کاروانەکەشی گۆڕی، کاروانەکە ڕزگاری بوو، ئەو ژمارە زۆرەی قورەیشیەکان کە بە سەرۆکایەتی (ئەبو جەهل) و (ئومەییە)و هەندێکی تر هاتبوون، کە ژمارەیان نزیکەی (١٠٠٠) کەسێك دەبوون، بەرامبەر سێ سەدو شتێك لە موسڵمانان، بەشداری جەنگیان کرد، لەم جەنگەدا (٧٠) کەس لە بێباوڕان کوژران و (١٤) کەسیش لە موسڵمانەکان شەهید بوون، لەم جەنگە زۆرێك لە سەرکردەکانی بێباوران کوژران، وەك (ئەبو جەهل)و (ئومەییە).

خوای گەورە هەر لەسەرەتای جەنگەکەوە پەیمانی بە پێغەمبەرو موسڵماناندا کە زاڵیان دەکات بەسەر بێ باوڕان و سەریان دەخات. ئەوەبوو سەرکەوتنی بۆ بەدەستهێنان و ژمارەیەکی زۆر لە دوژمنەکانیان بەدەستی موسڵمانان کوژران، بەشێکیشیان لێ بەدیل گیرا، لەسەرەوت و سامانێکی زۆر کە لە کافرەکان بۆیان بەجێما.

یەکێك لە دیلەکان (ئەبولعاص کوڕی ڕەبیع)ی مێردی (زەینەب) بوو.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فدیەی لەسەر دیلەکان دانا، بۆ ئەوەی خۆیانی پێ بکڕنەوە، ئینجا ئەم کڕینەوەش لە نێوان هەزار درهەم و چوارهەزار درهەم بوو، بە گوێرەی پلەو پایەی دیلەکان لەناو میللەتەکەیان و ڕادەی دەوڵەمەندی یان.

جا نوێنەرەکانیان دەهاتن و دەچوون لە نێوان مەککەو مەدینەداماڵیان لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرتبوو بۆ ئازادکردنی دیلەکانیان، (زەینەب)یش نوێنەری

خۆی ڕەوانەی مەدینە کرد، کە فدیەی هەڵگرتبوو بۆ ئازادکردنی (ئەبو لعاص)، فدیەکەش بریتی بوو لە ملوانکەیەك کاتی خۆی زەینەب لەلایەن خەدیجەی دایکیەوە پێی بەخشرابوو، لە ڕۆژی گواستنەوەیدا.

کاتێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەمەی بینی ڕووخساری پیرۆزی بە پەرۆکێکی تەنك داپۆشی، لەبەر خەم و پەژارە، ئەوەبوو زۆر بەزەیی بە (زەینەب)ی کچی هاتەوە، ڕووی لە یاوەرەکانی کردو فەرمووی: "زەینەب ئەمماڵەی ڕەوانە کردووە، بۆ ئازادکردنی (ئەبو لعاص)، جا ئەگەر بەچاکی دەزانن دیلەکەی ئازاد بکەن و ماڵەکەی بۆ ڕەوانە بکەنەوە، ئەوا بیکەن ئەگەرنا ئەوە ئێوە ئازادن".

ئەوانیش وتیان: بەڵێ.. ئەوەی دەیکەین لەبەر دڵخۆشی تۆ ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم). ئەوەبوو (ئەبو لعاص)یان ئازادکردو ملوانکەکەی (زەینەب)یشیان ڕەوانەکردەوە بۆ زەینەب.

پێغەمبەر (صلی الله علیەوسلم) شەرتێکی لەسەر (ئەبو لعاص) دانا، ئەویش ئەوەبو هەر کە گەیشتەوە (مەککە) یەکسەر بەبێ سستی و دواکەوتن (زەینەب) ئازاد بکات ڕەوانەی بکات بۆ لای

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

(ئەبو لعاص) بازرگان بوو، خاوەنی پەیمان و گرێبەست بوو، بۆیە پەیمانی دا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەر کە گەیشتەوە مەککە(زەینەب) ڕەوانە بکاتەوە بۆ لای باوکی.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێشتر ئەو دەسەڵاتەیان نەبو، بەهێز زەینەبی کچی بگەڕێنێتەوە لای خۆی و تا ئەوکاتەش ئایەت لەم بارەیەوە

نەهاتبووە خوار، کە ئافرەتی ئیماندار نابێ لەلای پیاوی بێ باوەڕ دابنیشێ، بۆیە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لەو کاتەدا ئەو شەرتەی بۆ(ئەبولعاص) دانا، لەلایەکەوە ئایەت دابەزیبوو ولە لایەکی ترەوە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هێزی پەیداکرد، دووژمنەکانیان ترسیان لێ نیشتبوو. (ئەبولعاص) هەر کەگەیشتەوە (مەککە) پەیمانی خۆی بەجێهێنا، ئەو پەیمانەی بە پێغەمبەری دابوو (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی بە (زەینەب) کرد، خۆی ئامادە بکات بۆ کۆچکردن بۆ لای باوکی، ووتی: ئایینی ئیسلام من و تۆی لێك جیا کردۆتەوە، پەیمانم بە باوکت داوە کە بتگەڕێنمەوە لای ئەو دەبێ زوو خۆت ئامادە بکەیت، نوێنەرەکانی باوکت لە رێگا چاوەڕێت دەکەن.

(زەینەب) رازی بوو، بە فەرمانی خوداو پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بە دورکەوتنەوەی لە مێردە خۆشەویستەکەی، هەرچەندە ئەم لێك جیا بونەوە بۆ(زەینەب) ناخۆش بوو، لەبەر ئەوەی لەگەڵ (ئەبولعاص) زۆر یەکتریان خۆش دەویست. بەڵام لەبەرئەوەی ئەبولعاص ئیمانی نەهێنابوو، هێشتا موسڵمان نەبوو، بۆیە ئایینی پیرۆزی ئیسلام لەیەکی جیاکردنەوە، زەینەب فرمێسکی زۆر رشت، بەڵام وتی: تەنها دەبێ گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەر بین (صلی الله علیه وسلم)، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: "قسەی کردو راستی کرد، پەیمانی داو جێبەجێی کرد"، و لەریوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (پاشان من کچی خۆم لە (ئەبولعاص) مارەکرد، قسەی کردو راستگۆ بوو).

**کۆچکردنی زەینەب بۆ مەدینە:**

لەو شەوەی کە زەینەب خۆی ئامادەکرد، بچێت بۆ مەدینە، (هندی کچی عوتبە) کە خێزانی (ئەبو سوفیان) بوو، هاتە لای زەینەب، کە ئەو کاتە باوك ومام و برای کوژرابوو لە شەڕی بەدر، بەلآم هاتە لای زەینەب ووتی: لە رۆیشتندا پێویستیت بە چ هەیە؟ ماڵ پارە هەر شتێکی ترت پێویستە، شەرم مەکە، من یارمەتیت دەدەم).

زەینەب زۆر سوپاسی هەڵوێست و نەرم و نیانی (هند)ی کرد، بۆ ئەم رەوشتە جوانەی.

زەینەب پاش ئەوەی خۆی ئامادەکرد، لەگەڵ (کینانەی کوڕی رەبیع)ی شوبرای واتە لەگەڵ (کینانە)ی برای (عاص) کەوتنە رێ بۆ رۆیشتن بەلآم بێ باوەڕان کاتێك بەم کۆچکردنەیان زانی، هەڵسان بە دوایان کەوتن،(هەباری کوڕی ئەسوەد) و (نافیعی کوڕی عەبدی عەمرو فەهری). هەبار هەڵسا بە لێدانی رەمح لە زەینەب، زەینەب بریندواربوو خوێنی لێ رژا، بۆیە کینانە بە ناچاری زەینەبی گەڕاندەوە مەککە تاکو ژیانی نەکەوێتە مەترسیەوە.

عاص کاتێك زانی ئەمە بەسەر زەینەب هاتووە نیگەران بوو، لەلایەك زۆر سووی لە زەینەب بۆوە، لەلایەکی تر لەبەر پەیمانەکەی کە لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) داویەتی: کە زەینەب بە پەلە بگەڕێنێتەوە لای، بۆیە دوای دوو شەو یاخود سێ شەوی تر، جارێکی تر دووبارە کینانەی لەگەڵ (زەینەب) دا کەوتنەوە رێ وبردی بۆ لای ئەو دوو پیاوەی کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ناردبووی بۆ دەرەوەی مەککە.

کینانه (زەینەب)ی رادەستی ئە دوو پیاوە کرد تاوەکو زوو بیگەڕێننەوە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) یەکەم جار بڕیاری دا ئەو دوو پیاوە بێ باوەڕە، واتە (هەبار و نافیع) بسوتێندرێن، بەلاّم پاشان پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) رای گۆڕی، چونکە خوای گەورە لەدوا رۆژدا مرۆڤ دەسوتێنێ، نابێ سزا بە سزای خوا بچێ، بۆیە بڕیاری دا بکوژرێن.

زەینەب لەگەلّ نوێنەرەکانی رۆیشت تاکو گەیشتنە مەدینە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هاتە پێشوازی لەگەلّ (ئوم کەلسوم و فاتیمە)دا، بەلاّم روقیە وەفاتی کردبوو. لە ریوایەتێکی تر (هەیسەمی) لە (مجمع الزوائد)دا دەگێڕێتەوە لە (عروەی کوڕی زوبێر) دەلّێ: دوو پیاو لە قورەیشیەکان دوای (زەینەب)ی کچی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کەوتن و شەڕیان لەگەلّدا کردن، تاوەکو سەرکەوتن پالّیان نا بە زەینەب و بەریانداوە سەری کەوت بەبەردێك و خوێنێکی زۆری لێ هات، بردیانەوە لای ئەبو سوفیان و، ئافرەتەکانی (بەنی هاشم) هاتن بۆ لای. پاشان کۆچبەرێك هات و لەگەلّ خۆی دا بردی، بەلاّم زەینەب ئەم برین و ژانەی کۆتایی نەهات، تاوەکو دواتر بەم هۆیەوە کۆچی دوایی کردو شەهید بوو. ( الهاشمی، الطبري وهو مرسل، ورجال الصحیح ریوایەتیان کردوە).

زەینەب خوێنێکی زۆری لێ رژابوو، بۆیە نەخۆش کەوت وکەوتە ناو جێ، لەژێر چاودێری باوکیدا بوو، کە زۆر بە سۆز بوو لەگەلّیدا، خوشکەکانی (فاتیمەو ئوم کەلسوم) چاودێریان دەکرد.

زەینەب زۆری چاوەڕێ کرد بۆ موسڵمانبوونی مێردەکەی (ئەبو عاص) تاوەکو خوای گەورە چاوەکانی پێ گەش بکاتەوە، جیابوونەوەی (زەینەب و ئەبوعاص ) زۆ ناخۆش بوو، هەردووکیان یەکتریان لە بیر نەکردبوو، (ئەبو عاص) هەردەم یادی زەینەبی دەکردەوەو زۆر بیری دەکرد، کە ئایینی پیرۆزی ئیسلام لێکی دوور خستبوونەوە.

پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) بە ئەمین ناوبردرا، ئەویش لەبەر ئەوەی دڵی رۆناك و راست و چەسپاو بووەو ئەمانەت پارێزراو بووە بۆ رێکخستنی موسڵمانانیش هیوا بەجێ بووەو هیوای گەروەی بە دەست هێناوە.

(ئەبولعاص) هەر بە کافری مایەوەو گومڕابوو تا پێش رزگارکردنی مەککە، بۆ بازرگانی سەفەری شامی کرد، قورەیشیەکان دەیانزانی باوەڕیان هەبوو، بە ئەبولعاص کە دەست پاك و بە وەفاو راستگۆو بەڕەوشتە. بۆیە ماڵ و سامانی خۆیانی پێ ئەدا بۆ بازرگانی.

ئەبولعاص ئەو شتانەی پێی بوو فرۆشتی و شتی تری پێی کڕی، لەکاتی گەڕاندنەوەیدا لە رێگا توشی سریەکی موسڵمانان بوو، موسڵمانەکان رێگایان بەکاروانەکەی گرت، ئەم سریەیە بەسەرۆکایەتی (زەیدی کوڕی حارثة) بوو، گەمارۆی کاروانەکەیانداو هەموو پیاوەکانی (ئەبولعاص) بە دیل گیران و دەست بەسەر شتومەکەکانیشی گیرا، تەنها خۆی هەلآت و رای کرد، شتەکانی کاروانەکەیان لەگەڵ دیلەکان هێنا بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

کاتێك شەو داهات (ئەبولعاص) خۆی پێچاو بە دزیەوە بەرەو ناو مەدینە چوو، زۆر دەترسا نەوەکو کەسێك ببینێ و بیناسێ، خۆی گەیاندە لای (زەینەب)ی خێزانی وداوای لێ کرد پەنای بدات، ئەویش پەنای دا، هێندەی

